# رەووشتەکانی ئیمپریالیزم

# لە

# سایگۆن

برهان قانع

١٩٨٤

---

لەم نامیلکەیەدا ـ تارادەیەک ـ لە تاوانەکانی ئیمپریالیزم
تێ دەگەی

# رەووشتەکانی ئیمپریالیزم

# لە

# سایگۆن


برهان قانع



١٩٨٤


---

لەم نامیلکەیەدا ـ تارادەیەك ـ لە تاوانەکانی ئیمپریالیزم
تێ دەگەی

**پێشکەشە :**

بەو کەسانەی تا دواکاتی ژیانیان

بەرامبەر بە ئیمپریالیزم ئەجەنگن ..

● برهان ●

---


● ئەم نامیلکەیە لە ئینگلیزییەوە کراوە بە فارسی

● برهان قانع بە کورتکراوەیی کردویە بە کوردی

● چاپی یەکەم ١٩٨٤

● چاپخانەی « حوادث » بەغدا

## پێشەکی‌یەکی کورت :

بە دەگمەن ڕێ ئەکەوێ هەبێت ( تا ڕادەیەك ) ڕەووشتو سروشتی ئیمپریالیزم نەناسێو لێ‌ی تێ نەگەیشتبێ ..

ئێمە ، لەم نامیلکە بچکۆلەیەدا ـ ئەوەندەی بۆمان بکرێ ئمپریالیزم بە خوێنەران ئەناسێنین‌و ماهیەتی دژی مرۆڤایەتی‌و سروشتی سەرمایەداری رون ئەکەینەوە .

کارێکی پێویستە خەڵکی زۆر تر شارەزای شێوە جۆر بەجۆرەکانی تاوان‌و خیانەتەکانی جیهانی سەرمایەداری بن.. هەر چەند ناسینی رواڵەتی ئیمپریالیزم‌و پێناسە کردنی کارێکی ئەوەندە سوكو ئاسان نیە کە لە کورتە باسێکی وەکو ئەم نامیلکەیەدا بە تەواوی شوناسنامەکەی بخرێتە بەر چاو .. بەڵام ئەمە وەکو سەرەتایەکە بۆ ناسینی دڕندەیەتی سیستەمی ئابوری ـ کۆمەڵایەتی سەرمایەداری .

رزگار بون له دەست ئیمپریالیزم ( به تایبەتی ) لەو ولآتانەدا کـه ئابوری‌یان به ئیمپریالیزمەوه گرێدراوه ، کارێکی شۆرشگێرانەیەو لـــه ئەستۆی کرێکاران‌و زەحمەتکێشانی ولآتدایه که شۆرشگێرترین‌و هۆشیار ترین چین‌و توێژەکانی کۆمەڵن •• وه هــەر ئەوانن توانــای ئەم کاره مێژوویەیان هەبێت •• چونکه رەووشتی ئیمپریالیزم سەرچاوەکەی لـه ناخی ملْکداریتی تایبەتی‌و بــه خاوەنبوونــی هۆیەکانــی بەرهــەم هێنان‌و تالآنکردنی هێزی کارەوه هاتووه •

دەزگــا ئینحیساری‌یەکان‌و ( ئالیــگارشی مالی )[1] بونەته ســەگی پاسەوانی پاراستنی سیستەمی ئابوری سەرمایەداری بۆیه ئەرکی ســەر شانی هەمو شۆرشگێرێکه شان به شانی تێکەیشتنی له ناخی ئیمپریالیزم‌و سیستەمه ئابوری‌یەکەی دژی هەمو لایەنەکانی دەسەلآتی بووەستی‌و هەوڵی له ناو بردنی بدات ••

لەبەر ئەمه ، ئەم نامیلکەیه پێشکەش بەو کەسانه ئەکەم که تا دوا کاتی ژیانیان دژی ئیمپریالیزم تێ ئەکۆشن‌و ئەجەنگن •

**● برهان قانع ●**

---

(۱) Oligarchie.

**نووسەری ئەم کتێبە لـــە زمـانی**

**یەکێکی ترەوە ئەگێڕێتەوە ئەڵێ(١) :**

کاتێك بردمیان بۆ هۆردوگایەك لە ناوچەی ( سایگۆن ) لە ڤێتنامی خواروو ، زوربەی قەدی دیوارەکانم دی خوێناوی بون ..

جاری دووەم کە بردمیانەوە بۆ هەمان شوێن ، هـەروەکو جـاری پێشو ئازارو لێدان دەستی پێ کردەوە ، ئەوەی یەکەمجار بەسەرم هـات هەمووی دوبارە کرایەوە ، ماوەی چەند کەژمێرێك بە بنمیچە کەدا سەر بەرەوخوار هەڵیان واسیم .. دار کاری‌یەکی باش کرام ، بە زۆر نـاو زگمیان پڕ کرد لە سابوناو .. ماوەی ساڵێك ناو بەناو هەر جارەی دو مانگ یان زیاتر ئەمکارە درێژەی ئەکێشا . تا رادەیەك ، ئەقڵم لەسەر خۆ نامابو ، یەکەمجار دومانگ‌و نیوی خایاند ..

---

(١) نووسەری کتێبەکـــە لـــە زمـــانی لادێ نشینێکی دەوروبەری سایگۆنەوە ئەدوێ ..

کچێکی تەمەن هەژدە ساڵانیش لەو شوێنەدا حەپس بو بە چوار پەل بەستراوی هەڵیان واسیبوو ، ئازاریان ئەدا ، لەو کاتەدا سەرماو سۆڵەی زستان زۆر توند بو .

هەموو ئەو ئافرەتانەی کە گیرابون هەر بەو جۆرە رەفتاریان لەگەلا ئەکرا ، هەمو جار دوای ئازارو ئەشکەنجە لە زوورە ساردەکانا لەپەوڕو تەخت رایان ئەکێشان . هەر کەسێکیان بخستبایە بە زەوی‌دا ئاوی ساردیان پیا ئەکردو بۆ ماوەیەك سەرو گوێلاکیان ئەکوتا .

هەمو کات کە دەستیان ئەکرد بە لێدان‌و ئازاردان هەر جارەی دوو مانگ درێژەی ئەکێشا .. بەمجۆرە تا هەفتەیەك بەر لەوەی بەرەڵلا بکرێم ئازارم نۆشی . لەگەل هەمو کەسێکدا بەو جۆرە ئەجولانەوە .

کاتێك بەرەڵلا کرام ، وەکو سەر لەنوێ لە دایك بوبێتمەوە وام ئەزانی .. هاوڕێکانم گەلێك ئامۆژگاری‌یان کردم ، ئەم مانەوەیەم بە گەورە ترین سەرکەوتنی ئەزانم .. ئەو دەیان هەزار کەسەی گیرابون هەر کامێکیان بەرەڵلا ئەبوو بە نوقستانی لە هۆردوگاکان ئەهاتنە دەرەوە .

ساڵی ١٩٦٠ بو ئازاد کرام ، لە ساڵی ١٩٦٢دا دیسانەوە جارێکی تر گیرامەوە ، بردمیان بۆ گوندێکی ستراتیجیکی یان بڵێن ( هۆردوگای زۆرە ملی ) کە پێ‌یان ئەووت ( گوندی هاوچەرخ ) .

ئەو گوندانە بە تایبەت بۆ ئەو کەسانە دروست کرابون ـ کە بەربەرەکانێی رێژیمیان ئەکرد ـ حەز ئەکەم ئەوەتان بۆ رون بکەمەوە ئەو گوندە ستراتیجیکی یان زۆرە ملی‌یانە چۆن وە بۆ چ مەبەستێك دروستکرابون .. وە چ مەفهومێکیان هەبو ..

ڕژێیمی سایگۆن لە سەرەتاوە فڕۆکەکانیان ئەنارد بۆ ئەوەی ئاوایەکان بۆمباران بکەن ، دوای ئەوە سەربازە ئەمەریکایەکان پەلاماری ئاوایی‌یە بوردومان کراوەکەیان ئەدا ، ئینجا بە بۆڵدزەر هەموو خانوەکانیان ئەڕوخانو وێرانیان ئەکردن ، لەگەل خاکا تەختیان ئەکردن ٠

دوای ئەوە خەڵکەکانیان بە زۆرو ناڕەزا جەڵە ئەکردو ئەیانبردن بۆ گوندە بەناو ستراتیجیکی‌یەکان ـ هۆردوگا زۆرەملی‌یەکان ـ کە ئەویشیان بە بێگارو زۆرەملی بە خەڵکی هەژاری ناوچەکە دروست کردبو ٠

لە شارەکەی ئێمەدا نزیکەی دو سەد هەزار کەس‌و ـ بگرە زیاتریش ـ ئەژیان ، ئەم هەمو خەڵکەیان بە زۆر برد بۆ گوندی ستراتیجێکی واتا هۆردوگای زۆرە ملی ٠٠ لەو شوێنانەدا لێپرسراوە ئەمەریکاییەکان وەکو ئاژەڵ سەیری خەڵکەکەیان ئەکرد ٠٠ هیچ ڕێزێکی ئەو خەڵکە زۆرلێکراوانەیان نە ئەگرت ٠

خەڵکەکە لە هەر ڕێگایەکەوە بۆیان بکرابایە بەربەرەکانێی ڕژێیمی سایگۆنیان ئەکرد ٠٠ گەلێك ئافرەتی تیا بو کە سەربازە ئەمەریکایەکان خانو بەرەکانیان وێران کردبونو بێ خانەو لانە مابونەوە ٠ بە سەدان پیرەمێرد لەناو کەلاوەی خانوەکانا ئەسوتان بێ ئەوەی کەسێك بەزەیی پیایانا بێتەوەو دەریان بێنێ ٠

زوربەی ئافرەت‌و پیاوان بەڵێنیان دابو کە لەناو کەلاوەکانی باپیریانا بسوتێن‌و بە مل شۆڕی‌یەوە ئاوایەکەیان بە وێرانکراوی بەجێ نەهێڵن ٠

ئەوانە بێ چەك بون ، بەلام بە دارو تەورو تەورداس‌و کاردەوە

روبەڕووی سەربازە ئەمەریکایەکان ئەوەستان‌و بەگریانا ئەچوونەوەو دەستیان لە سەربازەکان ئەوەشاند ••

**بە سەربازەکانیان ئەووت :**

« ئەگەر میوانن ئەوا میوانداریتان ئەکەین ، ئەگەر بۆ ئەوەش هاتوون خانوەکانمان وێران بکەن‌و گوندەکەمان بسوتێنن‌و کێڵگەو باخ‌و پاوەنەکانمان بێ چۆڵ کەن ئەوا تا دوا تنۆکی خوێن داکۆکی لەسەر مانەوەی خۆمان‌و ژیانی گوندەکەمان ئەکەین •• چونکە گوندەکەمان بەشێکی بچوکە لە نیشتمانە ئازیزەکەمان‌و ئەیپەرستین‌و ، جێی ناهێڵین » •

لەبەر ئەوەی خەڵکی ئیمە(٢) ، بە زۆری لە سەر کێڵگەو باخ‌و بەرەی خۆیان کاریان ئەکردو ئەژیان ، هەریەك لە لا شیوو کاناوێك ئەژیا •• حەزیان لەوە نەئەکرد لە هۆردوگایەکی زۆرە ملی‌یانەدا بەو جۆرە کۆ بکرێنەوە ، هەمیشە رقیان لەو جۆرە ژیانانەی ناو ئەو گوندە هۆردوگا شێوانە ئەبۆوە کەهەر چوار دەوریان بە تەلی دڕکاوی تەنرابو ، چەندان بورجی روانگەو پاسەوان‌و سەگی مەشق پێکراوی بۆزەن‌و نهێنی دۆزەرەوەو ئەمجۆرە شتانەی تیابو •

لەو هۆردوگا زۆرەملی‌یانەدا خەڵکەکە ناچار ئەبون بە بێگاری کار بکەن ، خەڵکیان بە زۆر وەها ناچار ئەکرد کە دەستەمۆی دەزگاکانی

---

(٢) ئیمە واتا فەلاحە سایگۆنی‌یەکان

دەوڵەتی سایگۆن بن • لاوەکانیان بەزۆر ئەکرد بە سەربازو چەکیـــان ئەکردە شانیان‌و بە زۆر ئەیانکردنەوە بەگژ خەڵکی لادێ ئازادەکانی هاو نەتەوەی خۆیانا ••

**حەز ئەکـــەم لەم رووەوە بەسەرهاتی گوندی «تانکور»(٣) تان بۆ باس بـکەم :**

خەڵکی ئەو گوندە هەموی ٥٩ پەنجاو نـۆ کەس بـون ، بە زۆر هەمویان بردن بۆ ناو ئەو گوندە هاو چەرخە شێوە هۆردوگا زۆرەملی‌یە• لە ماوەی ٣ سێ مانگدا ٣٢ سی‌ی‌و دو کەسیان لێ مردن لە دێی ( هۆ ئاترونگ ) (٤) لە ژمارەی ٤٠٠ چوار سەد کەس کە بە زۆر بردبونیان بۆ ناو هۆردوگاکە ٢٠٠ دو سەد کەسیان لەبەر ناخۆشی باری ژیـــان‌و نەبونی هۆیە پێداویستی‌یەکانی ژیان مردن •

لە هۆردوگای زۆرە مـلی « بـن تو ئونـگ »(٥) کە ئەفسەرە ئەمەریکایەکان بە زۆری دروستیان کردبو هەموو کاروبارێکیان بەڕێـوە ئەبرد ، لە کاتی سەردانی « مەکنمارا »دا خەڵـکەکە بـە جارێـك خـۆ نیشاندانێکی گەورەیان ساز کردو هەمـو داوای نان‌و ژیانیـان ئەکرد • داوایان ئەکرد کە بیانگێڕنەوە بۆ گوندە راگوێزراوەکانی خۆیان ، بـۆ ئەوەی لەوێ سەربەستانە بە ئـازادی بژیـن •• لەگەل کێڵـگەو باخ‌و کانیاوەکانا ژیان بەسەر بەرن •

---

(٣) Tankor .
(٤) Hoatrong.
(٥) Bin to ong:

کاربەدەستانی هوردوگاکان هەر کەسێکیان بناسیبایە کە خزم‌و کەسوکاری لە ناوچەی ژورووی ولاتی سایگۆندا هەیە ، یان دژی فەرەنسەیەکان ئەجوڵێتەوەو کار ئەکات ، یان هەر کەس لە بارەی هەڵبژاردنەوە قسەی کردبایە یان دەمی لە دیموکراتیەت‌و ئازادی بکوتابایە .. یان رەخنەی لە دەوڵەتی دەسکردی سایکۆن یان ئەفسەرە ئەمەریکایەکان‌و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بگرتبایە دەمودەس ئەیاندانە دەست پۆلیس‌و راپێچی بەندیخانەکانیان ئەکردن .

سەربازە ئەمەریکایەکان بە شێوەیەکی زۆر ناشیرینانە دەست درێژی‌یان ئەکردە سەر رێزو کەرامەتی ئەو کچانەی بە زۆر لە هۆردوگا زۆرەملی‌یەکاندا نیشتەجێ کرابون‌و رێزیان ئەشکاندن ..

وە نەبێ ئەو هۆردوگا زۆرە ملی‌یانە تەنیا لە خەڵکی لادێکان پێك هاتبێت ، بەڵکو خەڵکێکی زۆریشیان لە شارەکانەوە بۆ ئەبردن . دەوڵەتی سایگۆن بە دەیان هەزار کچیان لە هۆردوگاکانا کۆ ئەکردەوە ، بە ناشیرینترین شێوەی سزا سزایان ئەدان .

کاربەدەستانی حوکمی سایگون ، بۆ ئەوەی خەڵکی گوندەکان ناچار بکەن خۆیان داوا بکەن بچنە هۆردوگاکانەوە لەگەڵ کاربەدەستانی پۆلیس‌و سوپادا بە زۆر خانوەکانیان ئەسوتاندن باخەکانیان ئەبرین‌و کانیاوەکانیان پڕ ئەکردنەوەو بێ خانەو لانەیان ئەخستن . لەکاتی سوتاندنی لادێکاندا ئوتومبێلی ئاگر کوژێنەوەیان ئەنارد بۆ لادێکان‌و لە جیاتی ئاو بەنزینیان ئەکردە هەمارەکانیان‌و ئاوایەکانیان بە بەنزین ئاو پرژێن ئەکردو ئینجا ئاگریان تێ بەر ئەدان .

چەندان گوندی خاوەن کشتوکاڵو ئاژەڵداری‌یان بەو جۆرە سوتانو وێران کرد • باری ژیانی گوندە ئازادەکانیان(٦) بە جۆرێك ناخۆش ئەکرد کە خەڵکە کە ، ژنو پیاو ، منداڵو گەورە لە دەست ئەو بارە نالەبارە هەڵ بێتو پەنا بەرنە بەر هۆردوگا زۆرە ملی‌یەکانو بە پێی ئامۆژگاری ئەفسەرە ئەمەریکایەکان بجوڵێنەوە •

سەربازە ئەمەریکایەکان بچوبانایەتە هەر گوندێکەوە ، خەڵکەکەیان بەزۆر لە ئاوایی ئەکردە دەرەوە ، خانوەکانیان هەمو ئەروخاندن ، باخو کێڵگەکانیان وێران ئەکردن ، پەرژینە کانیان ئاگر تێ بەر ئەدان ، کانیاوەکانیان بە بۆڵدزەر پڕ ئەکردنەوەو لە هەر چوار لاوە ئاگریان بەر ئەدایە لەوەڕگاو پاوەنەکانو هەمو کێڵگەو باخو پەرژینەکانیان ئەسوتاندن• هەرکەس لە دانیشتوانی گوندەکە بەرهەڵستی سەربازە ئەمەریکایەکانی بکردبایە گولە بارانیان ئەکرد •

لەو هۆردوگا زۆرە ملی‌یانەدا بە هەزاران منداڵی هەژاری دەسکورت لەناو پاشماوەی ماڵە ئەفسەرە ئەمەریکایەکانا وەکو مشك خۆشو خاڵیان ئەمدیوو ئەودیو ئەکردو بۆ خواردن ئەگەڕان •

ئەمە نمونەیەکی جۆری ژیانی خەڵکی لادێو هۆردوگا نشینەکانی ناوچەی خوارووی وڵاتو دەورو بەری سایگۆن بو بە تایبەتی •

لەبەر ئەوەی دروست کردنی ئەو هۆردوگا زۆرە ملی‌یانەو ژیانی ناو هۆردوگاکان پێچەوانەی ئارەزو ویستو قازانجی خەڵکی ڤیتنام بو •

---

(٦) ئەو گوندانەی کە هێشتا رانەگوێزرابوونەوە ••

خەڵکەکە بە گەورەو بچوکەوە ، ژنو پیاو رقیان لێی ئەبۆوەو بەرهەڵستی ڕاگوێزانەوەکە ئەوەستان داوای گەڕانەوەیان ئەکرد بۆ شوێنەکانی خۆیان .

خەڵکەکە راپەڕین ، راپەڕینێك لە پێناوی ژیانو مەسەلەی ژیاندا . هەروەکو باسمان کرد ، کاربەدەستانی دەوڵەتی سایگۆن لە سەرەتاوە توانی یان بەزۆر گوندەکان بە خەڵك چۆڵ بکەنو بیانسوتێننو خەڵکەکە بە ناچاری لە هۆردوگاندا نیشتەجێ بکەن ، کە پێیان ئەوتن « گوندی ستراتیجیکی » یان گوندی هاوچەرخ ، یان هۆردوگای زۆرەملی .

بەڵام لە ئەنجامدا بەرە بەرە خەڵك بیری کردەوەو یەکیان گرتو کەوتنە خۆ گورج کردنەوە لەدژی کاربەدەستانو لێپرسراوانی ریژیمی ناو گوندە ستراتیجیکی یەکان واتا « هوردوگا زۆرە ملی یەکان » .

خەڵکی زۆر لێکراوو بەزۆر راگوێزراو توانی یان یەك بگرنو گەلێك لەو هۆردوگایانە بگرنە ژێر دەستی خۆیانەوە .. ئەو هۆردوگا ئازاد کراوانەیان کرد بە بنکەی راپەڕینو بەر هەڵستکاری ریژیمی سایگۆن .

کاتێك باوكو دایکان رێگایان لە رۆڵەکانی خۆیان ئەگرت کە نەچن بەگژ کاربەدەستانی هۆردوگاکاندا ، کوڕەکان لە وەڵامدا ئەیانگوت : « مەگەر ئێوە نابینن کە سەربازە ئەمەریکایەکان چۆن باوك لە منداڵو دایك لە کۆرپە جیا ئەکەنەوەو ، بە زۆر بێگاریان پێ ئەکەن .. مەگەر ئەمەیە ئەو ژیانە بەختیاری یە تازەیە کە

« مەکنمارا » بۆ ئێمەی دۆزیوەتەوە لە گوندە بەناو هاو چەرخە کاندا ؟ مەگەر ئەمەیە مەکنمارا پێی ئەڵێـت [ ژیانی سەقامگرتوو ] ؟ چۆن ئێوەی دایكو باوك داوا لە ئێمە ئەکەن لەم ژیانە سەرشۆڕی‌یەدا زیاتر بمێنینەوەو خۆمان رزگار نەکەین ؟ ئێمە هەر ئەبێ رزگار بین » •

لەو هۆردوگایانـەدا تیرۆرو شـەوکوتو پیـاو کوشتن‌و ناگومانی یەکجار زۆر بو ، بە جۆرێك زۆر بوبو هیچ خرابەیەك لە روناکی رۆژ خۆی نەئەشاردەوە • رۆژ بە رۆژ خەڵکەکە زیاتر لە ناخـۆشی ژیـان‌و باری گوزەرانی ناو هۆردوگاکان تێ ئەگەیشتن‌و زیاتر یەکیان ئەگرت‌و توند تر رائەپەڕین •

خەڵکەکە هەوڵیان ئەدا هۆردوگاکان بەجێ بهێڵن‌و کاربەدەستانـی دەوڵەتی سایگۆن‌و ئەفسەرە ئەمەریکاییەکانیش هەوڵیان ئەدا بەزۆر بیـان هێننەوە بۆ هۆردوگاکان‌و بیانخەنەوە ژێر رکێفی خۆیانەوە •

کاتێك سەربازە ئەمەریکاییەکان لە گەل دەستەیەك لە کاربەدەستەکانی ڕیژیمی داتاشراوی سایگۆن هاتنە شاری « بن‌دین »(۷) ، یەکەم کار کە کردیان دو ئافرەتیان گولەباران کرد •• یەکێکیان دو گیان بو ، ئەویتریان تازە منداڵی بوبو واتا « زەیسان » بوو •

کە دەستیان بە گرتنی خەڵکی هەر شوێنێك بکردایە ، شتێکی ئاسایی بوو ئەمجـۆرە کارانە بـکەن بـۆ ئەوەی خەڵـك لێیان بـترسن‌و کەس بەربەرچی کارەکانیان نەداتەوە • یەکێك کە خۆی ئەمکارانەی بەچـاو دیتبو گێڕایەوە وتی :

---

(۷) Ben Den.

« كاتێك سەربازە ئەمەریكاییەكان هاتنە ناوچەكەوە ، ٣٢ ژنو ٣٥ منالو شەش پیرە پیاویان پێكەوە شەتەك داو ئینجا گولەبارانیان كردن • چەندان مندالی دو سالانەیان گرتو پارچە پارچەیان ئەكردنو لاشە لەتكراوەكانیان فڕێ ئەدانە ناو ئاگرەوە • • سەری منالەكانیان بەدار حەیزەرانەكانی دەستیان پانو پلیش ئەكردەوە » •

منداڵێكی بچكۆلەم ئەناسی ناوی « زونگ »(٨) بو ، پاش ئەوەی سەربازە ئەمەریكاییەكان هەردو لاقەكانیان شكاند زیندە بەچاڵیشیان كرد •• « واتا بە زیندویی خستیانە ناو گۆڕێكەوە » •

ئەم روداوە لە ٢٢ی مانگی كانونی یەكەمی ساڵی ١٩٦٥دا بـو ، هەروەها لە گوندی « تای كوانگ »(٩) هەر لەو پەلامار بردنە دڕندانەیەدا چەندان خێزان لە ناو چون بە تایبەتی ماڵێكی حەوت سەر خێزانی لە هەمان گوند بەزیندویی ئاگریان تێ بەردان • ماڵێكی نۆ سەر خێزانی تریش بە یەك دەسترێژ گولەباران كران ، رودوای ناخۆش زۆرە تەنیا ئەوەندە بۆ نمونە باس كرا •

ئەمكارانە ، هەموو رۆژو لە هەمو ناوچەكانی تری خواروی ولاتدا دوپات ئەكرانەوە •• خەڵك بە جۆرێك ئازاری نۆشیبو كە هەرگیز دڵیان بەرامبەر بە ریژیمی سایگۆنو ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا پاك نەئەبۆوە •

---

(٨) Zong.

(٩) Tay Kooang .

دوای ئەوە لەو هۆردوگا زۆرەملی‌یانە رزگارم بۆ[10] دیسانەوەمو چەند جارێکی تریش بردمیانەوە بۆ ناو هۆردوگاکان •• چەندان تاوانی لەمانە گەورە ترو پڕ لە ناسۆر ترم لەو هوردوگایانەدا دیوە ••

پیاوێك کە ناوی « دۆنگ »[11] بوو هێشتا ماوە [12] وئیستا لە هۆردوگا رایکردوەو لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی دەرەوەی هوردوگاکاندا کەوتووە گەلێك تاوانی لەمانە گەورە تری بە چاوی خۆی دیوە بۆی گێرامەوە وتی :

زۆر شتی نارەوام دیوە ، تەنانەت زوربەی ئەندامانی کارەساتەکان هێشتا زیندوون ، حەز ئەکەم باسی بۆمباران‌و گازی ژەهراوی‌و گازی کیمیایی‌و ناپاڵم‌و فوسفۆرو ژەهرو •••• هەمو ئەو تاوانە دڕندانەی ئەمەریکاییەکان‌و دەوڵەتی داتاشراوی سایگۆن ـ کە هەمو رۆژ دوبارە ئەبنەوە ـ باسیان بکەم •

ئەمجۆرە کارانە ، رۆژانە لە لای خوارووی وڵاتدا دوپات ئەبوونەوە •• منیش وەکو هەر نیشتمان پەروەرێك بە توندی بەرپەرچی ئەو کارە نارەوایانەم داوەتەوە ••

زۆر کەسیش ئەناسم کە لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیانا کڕنوشیان بۆ ئەفسەرە ئەمەریکاییەکان ئەبرد •

---

(١٠) مەبەست هەمان کابرای سایگۆنی‌یە کە باسەکە ئەگێڕێتەوە

(١١) Dong.

(١٢) مەبەست کات‌و سەردەمی نوسینی باسەکەیە ••

زیانی زۆری ڤیتنامیەکان بە تایبەتی لەساڵەکانی ١٩٥٤ ـ ١٩٥٩ یان لە ساڵەکانی « صولح » ئاشتی راگرتن لە ١٩٦٠ ـ ١٩٦٦ بوو . واتە ئەو ساڵانەی کە خەڵك لە خوارووی وڵات راپەڕیبونو ئەمەریکایەکانیش ناوچەکانی ژورووی سایگۆنیان یەك بین بۆمباران ئەکرد .

ڤیتنامیەکان ، لە لێپرسراوانی گەورەوە تا ئەندامە بچوکەکانی ناو کۆمەڵ زوربەیان ناسراویم لە گەلیانا هەبو ، زۆر شتیان بۆ ئەگێرامەوە ، بەراستی خەڵکێکی خۆ راگرو نیشتمان پەروورن .. ئەوانە زۆر بەباشی لە رەووشتو ماهیەتو ئەخلاقی داگیرکارانەی ئەوروپاییەکانو ئەمەریکاییەکان گەیشتبوون .

لە کاتێکدا لەگەل « پهام وان دونگ »(١٣) سەرەك وەزیرانی ـ ئەو کاتەی ـ ڤیتنام لە بارەی ئاستی هوشیاری خەڵكو وڵاتە یەکگرتووەکانو توانای خۆراگرتنی خەڵکی ڤێتنامەوە قسەمان ئەکرد ، چەندان هەلوێستی ناشیرینی لێپرسراوە ئەمەریکایەکانم بەرچاو ئەکەوت کە بە تەواوی ئازاری ویژدانمیان ئەدا .. پهام وان دونگ ، دەستمی گرت وتی :

**« برای بەرێز ، راپەڕینەکە درێژ خایەنە ، توانای خۆڕاگری خەلکی ئێمەش زۆرە »(*)**

---

(١٣) Phamwan Dong.

(*) لە راپورتێکی «رالوف سونیمان» لە ڤیتنام وەرگیراوە کە لە ١١ی مانگی نیسانی ١٩٦٦ دا بۆ «تراندراسل»ی ناردوە .

# ئیمپریالیزم چی‌یە ؟ (*)

**ماهیەت‌و ڕەووشتەکانی بە کورتی :**

ئەمرۆکە تەواوی خەڵکە زۆر لێکراوەکانی جیهان شارەزای هەمو جۆرە تاوان‌و دەست درێژی‌یەکانــی ئیمپریالیــزم بــوون ، بــە تایبەتــی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا .. وە خەڵك ئیمپریالیزم بە گەورە ترین دوژمنی سەر سەختی گەلان‌و خوێناویترین شێوەی تاوان ئەزانن .

ئەگەر لە کۆمەڵانی خەڵك بپرسین کە بۆچی ئیمپریالیزم وە لەبەر چی ئەمجۆرە تاوان‌و دەست درێژی‌یانەی کردوە بە پیشەی سیاسی خۆی، کەم کەس هەیە وەڵامی ئەم پرسیارەی دەقاندەق بۆ بدرێتەوە .

ئێمە لەم کورتە باسەدا ئەمانەوێ ـ تاڕادەیەك ـ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوەو تاوانەکانی ئیمپریالیزم لە بەردەم کۆمەڵانی خەڵکدا ئاشــکرا

---

(*) باسەکــــە نەختێك دورو درێژ تر بو لەبەر چــــەند هۆیەك کورت کرایەوە ـ وەرگێر .

بکەین •• ئەو کۆمەڵە خەڵکە زۆرلێکراوانەی کە رۆژ بە رۆژ زیاتر ماهیەتی پڕ لە تاوانی ئیمپریالیزمیان بۆ روون ئەبێتەوەو زیاتر ئەچنە مەیدانی بەربەرەکانێکردنی هەمو جۆرە دەسەڵاتێکیەوە •• ئێمەش ئەمانەوی هۆیە بنچینەییەکانی تاوانی سیستەمی سەرمایەداریو رێژیمە داتاشراوەکانیان بخەینە روو •

کارێکی پێویستە ، کۆمەڵانی خەڵکی تێکۆشەر هەر چەند زۆرتر شارەزای شێوە جۆربەجۆرەکانی تاوانو خیانەتەکانی جیهانی سەرمایەداران بنو شارەزای هۆی تاوانەکانیان بن ، بۆ ئەوەی باشتر بتوانن درێژە بە خەباتی لە پسان نەهاتووی خۆیان دژی ئەو سیستەمە بەد رەفتارە جیهانییەو خیانەتی دەستی بێگانەو تاوانەکانی ئیمپریالیزمی جیهانیو دەستەو دایەرە کۆنەپەرستە گرێدراوەکانی ناوخۆ •• بدەن ••

بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە ، پێویستە شارەزای شێوەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری ببین کە ئیمپریالیزم دوا قۆناغی گەشە کردووی ئەو سیستەمەیە •

شێوەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری کە دوا بەدوای شۆرشی پیشەسازی جێگای شێوەی بەرهەم هێنانی « کشتوکاڵی » (١) گرتەوە لەسەر پایەی چەوساندنەوەو دەست گرتن بەسەر رەنجی باڵی کرێکاراندا

---

(١) واتا دوابەدوای سیستەمی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری فیودالیزم

دامەزراوە •• ئـەم چەوساندنەوەیـە لە رێـگای کرێنی کاری رۆژانەی کرێکارانەوە ئەبێت •• رۆژانەیەکی کەم بە کرێکاران ئەدەن‌و بەرهەمێکی زیاد لە کرێی رۆژانەیانی لێ وەر ئەگرن •

ئەمانەی لای خوارەوە هەندێك لەو تاوانە ناشیرینانەن کە لە لایەن رێژیمی سەرمایەداری‌یەوە کراوەو پشتگیری‌یان لێ ئەکرێ :

کرێـکاران لەژێر باڵـــی سیســتەمی ئابوری ـ
کۆمەڵایەتی سەرمایەداری‌دا وەکو یەك لە ئازار کێشاندا
یەکسانن •• نمونەیەك لە وڵاتی « بەرازیل » دینینەوە
کە یەکێکە لە وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتین :

- خاوەن کێڵگەیـەکی گەورە لـە بەرازیـل دوازدە فـەرمان بــۆ کرێکارەکانی کێڵگەکەی دەرئەکات‌و ئەڵێت : هەرکەسێك یەکێك لەم فەرمانانەم بخاتە پشت گوێ‌و کاری پـێ نەکات لـە ماوەی ٢٤ بیست‌و چوار سەعاتدا لەناوی ئەبەم •• لە ئاشێکی قامیشی شەکری هەمان کێڵگەدا کرێکارێك کە ناوی « سیلوابە »(٢) بو ، داوا لـــە بەڕێوەبەری کێڵگەکە ئەکات کە رۆژی یەکشەمەی داهاتو مۆڵەتی بدات هەندێك ئیش‌و کاری خۆی هەیە جێ‌بەجێی بکات •• کاتێك کرێکارەکە لای بەڕێوەبەر ئەگەڕێتەوە دواوە ، بەڕێوەبەر دەمانچە حەوتیرەکەی دەر دێنێ‌و لە پشتی سەریـەوە دەسترێژێـکی لـێ ئەکات •

---

(٢) Silwaba.

● له مانگی مارتی سالی ۱۹۷۰ دا ، له گـودالی ، له یه‌کێـك لـه شه‌قامه‌کانی « رێـیرا » لاشـه‌ی حـه‌وت کرێـکاری کشتوکاڵـی دۆزرایه‌وه ، که هه‌مویان به ده‌مانچه‌ی حه‌وتـیر کوژرابون ٠٠ وه‌کو ده‌رکه‌وت ئه‌و کرێکاره کشتوکاڵی‌یانه پێکه‌وه چوبون بۆلای سه‌رمایه‌داره خـاوه‌ن کاره‌که‌یـان‌و داوایان لـێ کـردبوو کرێی رۆژانه‌ی چه‌ند رۆژێکیان که چه‌ند مانگه لای ماوه‌ته‌وه بیانداتێ ٠٠ ئه‌مه ئه‌نجامی داخوازی‌یه‌که‌یان بوو ٠

له هه‌ر گۆشه‌یه‌کی ئه‌م جیهانه فراوانه‌دا ئه‌توانین ئیمپریالیزم بـه رواڵه‌تی درندانه‌و شێوه‌ی ره‌فتاری سه‌رکوتکه‌رانه یا بناسینه‌وه ٠٠ له‌م روه‌وه ئیمپریالیزم ـ که‌م تا زۆر ـ بۆ هه‌رکه‌سێك ده‌رکه‌وتووه ، وه‌کو ئه‌و جه‌ڵه کوشتارانه‌ی که له شیلی ، بولیڤیـا ، دومنیـکان ، فه‌له‌ستین ، سه‌حرا ، زه‌فارو (۳) کـرا ، هـه‌روه‌ها ڤیتنـام گه‌وره ترین نیشانـه‌ی دوژمنایه‌تی خوێناوی مێژوویی ئیمپریالیزمه ٠

به‌ڵام له روانگه‌ی بواری ئابوری‌یه‌وه ، ناسینی رواڵه‌تی ئیمپریالیزم کارێکی ئه‌وه‌نده ساکارو ئاسان نیه ٠٠ پێویسته له‌م بواره‌دا سه‌رنجی ورد به کار بهێنرێ ٠ ئه‌بێت ئه‌وه بزانین که ئیمپریالیزم چۆن ئابوری ولاتان به خۆوه گرێ ئه‌دات‌و بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م گرێدراوی‌یه درێژه پێ بدات له چ رێگایه‌که‌وه هه‌نگاو ئه‌نێت ٠ سیاسه‌تی ده‌ستێوه‌ردانی ئیمپریالیستی ولاتـه سه‌رمایه‌داره‌کان ـ به تایبه‌تی ئه‌مه‌ریکا ـ ئه‌گاته ئه‌و راده‌یه که نه‌ك ته‌نیا کانزه‌کان‌و سه‌رچاوه‌کانی که‌ره‌سه‌ی خاوی ولاته گرێدراوه‌کان به تالان

---

(۳) ئه‌مانه‌و چه‌ندان ولاتی تری وه‌ك ئه‌مانه ٠٠٠

ئەبات‌و بازاڕە کانیشیان ئەکاتە مەڵبەندی فرۆشتنی کەلوپەلی بازرگانی خۆی .. بەڵکو جگە لەوانەش ، سەرمایەکانی ناو خۆو تەنانەت پاشکەوتە بچوکەکانی خەڵك لە بواری بەرهەم هێناندا ـ بە تایبەتی ـ « بە شێوەی بەستنی » کڕین‌و فرۆشتنی کەلوپەلی ئیمپریالیستیانە لە ڕێگای قەرزو قۆڵەو ئیعتیباراتی بانقەکانەوە ـ کە ئەیدەن بە سەرمایەدارە گرێدراوەکان ـ ئەگرنە ژێر دەسەلاتی خۆیان .

بەگەڕ خستنی پارە لەو وڵاتانەدا ، کە لە ژێر دەستی وڵاتە ئیمپریالیستی‌یەکاندان بە دەست خۆیانەوە ئەبێت .. لەبەر ئەمە ، مەسەلەی گرێدراوی ئابوری کە شان بە شانی وێرانکاری کشتوکاڵ‌و لەناو چونی بەشە جۆربەجۆرەکانی بەرهەم هێنانی ناو خۆیە ، مەسەلەیەکی ئەوەندە سوك‌و ئاسان نیە کە بە گۆڕینێکی ڕواڵەتی لە فەرمانڕەوایی کردنی سیاسی‌دا ، وەیان بە لابردنی دەزگایەکی سیاسی‌و دانانی دەزگایەکی سیاسی تر لە جێگای ، مەسەلەکە لەناوا نەمێنێ ..

ڕزگار بون لە دەستی ئیمپریالیزم لەو وڵاتانەدا کە ئابوری‌یان بە ئیمپریالیزمەوە گرێدراوە ، مەو وڵاتانەدا کە نینۆکی ئیمپریالیزم چەقیوەتە ناو دڵ‌و هەناوی هەمو هۆیە کۆمەلایەتی‌یەکان . ئەبێت لە لایەن کۆمەلانی زەحمەتکێشەوە کە شۆڕشگێڕترین‌و هوشیار ترین چین‌و توێژی کۆمەڵن چارە سەری بکرێ‌و جێبەجێ بێت .

سیستەمی سەرمایەداری کە بە ناو داکۆکی لەسەر ئازادی ئەکات ، لە واقیع‌دا بەربەرەکانێی ئازادی (٤) سەرمایەداری هێناوەتە کایەوە

---

(٤) بەر بەرەکانێی شێوە کانی بەرهەم هێنان ئەگرێتەوە ..

خۆی کردوه به خاوەنی سیستەمی حوکم کردنی پارلمانیانه •• له ماوەی گەشه کردنی خۆیا به جۆرێك دڕوندەیەتی نواندوه که لەگەل هیچ ڕژێمێکی دڕوندەو پیاو کوژی وەکو ئیمپەراتۆری‌یه بێ پارلمانی‌یەکانی رابوردودا بەراورد ناکرێ ••

رەووشتی تالانگەرێتی ئیمپریالیزم که تانو پۆی له دڕوندەیەتی‌و پیاو کوژی‌یەوه چنراوه ، سەرچاوەکەی له ناخی ملکدارێتی تایبەتی‌و به خاوەنبوونی هۆیەکانی بەرهەم هێنان‌و تالانکردنی هێزی کارەوه هاتوه •

رێکخراوەی نەتەوه یەکگرتووەکان‌و رێکخراوی خاچی سوری دەوڵەتان ، دەستەو کۆمەڵەکانی مافی جیهانی‌و ، ئاگاداری نامەکانی مافی ئادەمیزاد •• تا ئیستا هیچ یەکێك لەمانه نەیتوانیوه به ئەندازەی پێویست رێگای دڕوندەیەتی له ئیمپریالیزم بگرن •

ئیمپریالیزم له هەر هەل‌و مەرجێکی لەبار بۆ خۆیدا ئەتوانێت رێکخراوه مرۆڤایەتی‌یەکان ـ تارادەیەك ـ را بگرێ ، ئیمپریالیزمی ئەمەریکاو بەلجیك ، به بەر چاوی هەمو جیهان‌و هەمو ئەو دەستەو کۆمەڵ‌و رێکخراوه جیهانی‌و مرۆڤایەتیانەوه به ئاشکرا « لومومبا »ی سەرەك وەزیرانی شەرعی کۆنگۆیان کوشت •

لەماوەی ٢٤ بیست‌و چوار سەعاتدا چەترەوانە ئەمەریکایەکان شۆرشەکەی دومنیکانیان له خوێنا گلان پێچەوانەی هەموو داب‌و نەریت‌و عورف‌و عادەتێکی نێو دەوڵەتان نەخۆشخانەکەی « هانۆی »یان بۆمباران کرد •• به فیت‌و دەسیسەی دەزگا سەربازی‌یه کۆنەپەرستەکان حکومەتی نیشتمانی دکتور مصدق یان لەناو برد ••

هەموو ئەمكارە نارەوايانەو هەزارانی لەمانە نارەوا تریش بە بەرچاوی کۆمەڵو ڕێکخراوە جیهانیو مرۆڤا یەتی‌یەکانەوە ئەکرێن •

ئیمپریالیزم زیاد لە هەر شتێك پەنا ئەباتە بەر لەشکرە بەکرێگیراوەکانی وڵاتە گرێدراوەکان ـ کە ئالەتی سەرکوتکەرانەی دەستی دوژمنن ـ و پشتیان پێ ئەبەستێ • جگە لە هێزی کۆمەڵانی زەحمەتکێش‌و شۆڕشگێڕ هیچ هێزێکی تر توانای لەناو بردنی ئیمپریالیزمی نیە ••

**ئیمپریالیزم بەم پێنج ڕەووشتە تایبەتی‌یەدا ئەناسرێتەوە :**

١ ـ دەست گرتن بەسەر بەرهەم‌و سەرمایەی ئینحیاریو ـ بەربەرەکانێی نێوان کومپانیا کاندا • •

٢ ـ تێکەڵ کردنی سەرمایەی بانقیو بازرگانی لەگەڵ سەرمایەی سنعەتی دا ، واتە « ئالیگارشی مالی »(٥)

٣ ـ خستنە کاری سەرمایە لە جیاتی کەلوپەل •

٤ـ دروستبونی یەکێتی یەکانی سەرمایەداری ئینحیساری جیهانیو دابەشکردنی بازارە جیهانی‌یەکان •

٥ ـ دابەشکردنی وڵاتانی جیهان لە نێوان هێزە سەرمایەداری‌یە گەورەکانا •

---

(٥) وادیارە سەرەتای پەنجاکان ئەگرێتەوە •

دەست گرتن بەسەر بەرهەم‌و سەرمایەدا لە قۆناغێـکی دیاریکراوی گەشـــە کردنی خۆبەخۆیدا •• ئەبێتـە هۆی پەیدا بوونی ئینحیساری ئابوری •

ئەم دەزگا ئینحیساری‌یانە لەگەڵ ئەو هەموو قازانجەو ئەو رۆڵە گرنگەدا کە لە ژیانی ئابوریدا ئەیگێرن ، کەچی بۆ ئەوەی کانزەکان‌و سەرچاوەکانی کەرەسەی خاو بە تالآنی ببەن‌و دەست بەسەر بازارەکانی جیهاندا بگرن‌و هێزی کـاری کرێـکاران بە هەرزان بکڕن ، لەگـەڵ چەنـدان دەزگاو دامـەزراوی ئابوری‌و کومپـانیای گەورەدا خۆیان یەك ئەخەن ، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەمەیان ئاسانترە تاکو بەربەرەکانێی نێوان سەدان هەزار کومپانیاو کارخانەی هەمەجۆرە •

لە چـارەکە ســـەدەی رابوردودا ، لەگەڵ دەرکـەوتنی چـەندان کومپانیای گەورە کە نیشانەی سەرمایـەداری ئینحیـاری‌یە ، تەووژمـی جموجوڵی بازرگانی‌و دارایی نێو وڵاتان زیاتر لە جاران چارەنووسی وڵاتە گرێدراوەکانی خستۆتە ژێر چەمۆڵـەی خۆیـەوە •• چەنـدان دەزگـاو دامـــەزراوی بازرگـانی جیهانی وەکو جەنراڵ موتورز ، ئەمپـــریال کمیکال ، ئینداستریز ، رۆیال داچشل ، بانقی ئەمەریکا ، بانقی مانهاتان ، نەستەلە ، زیمنس ، فیات ، هیتاچی ، کرایسلر بریتیش پترو لیوم •••و چەندان کومپانیای نەوتی وەکو ئای • تی • تی .I. T. T و چەندان فابریقەی چەك دروست کردن وەکو ملك دانل‌و هینی ترو بە هەزاران کومپانیای تری تالآنکەرانەی وەکو فوردو ئەمجۆرە شتانەیان دامەزراندووە •

ئەم کارخانەو کومپانیانە کە تا ئیستاش بەشێـکی زۆری بازرگانێتـی نێو وڵاتانیان بە دەسـتەوەیە ، بە پێی سەرژمارێـك کە لە ساڵی ١٩٨٠ دا

کراوه گەورە ترین بەشی بازرگانی جیهانی‌یان بە دەستەوەیە •

ئەم کومپانیانە ، ئەتوانن هەڕەشە لە دەسەڵات‌و ژیانی دەوڵەتە دیموکراتی‌و گەلی‌یەکان بکەن ، هەروەکو چۆن ڕێژیمی دکتور مصدقیان لە ئیران‌و سوکارنۆیان لە ئەندونیسیا بەو دەردە گەیاندو ڕێژیمی ئەلیندی‌یان لە شیلی لەناو برد •• ئابوری دەوڵەتی نەیتوانی لە بەرامبەر کومپانیای ئای • تی • تی تەلەفۆنداو دەستەو دایەرە پیلانبازەکەیدا خۆی بگرێ بەڵام کومپانیایەکی سەرمایەداری توانی دەوڵەتێکی نیشتمانی لەناو ببات •

کومبانیاکانی وەکو ئای • تی • تی • حیسابی خۆیان نادەنە دەست هیچ دەوڵەتێك •• وە هیچ دەوڵەتێك ناتوانێت دەست بەسەر هیچ دەفتەرو حیسابێکی ئەو کومپانیایەدا بگرێ •

ئەم کومپانیایانە ، وەکو دەوڵەتێکی نهێنی لەناو ئەو وڵاتانەدا کە ئابووری‌یان بە ئیمپریالیزمەوە گرێدراوە کار ئەکەن • گەلێك نۆکەرو جاسوس‌و کرێگرتەیان لەناو دەزگائیداری‌و سەربازی‌یە کانی دەوڵەتە گرێدراوەکاندا هەیە •• بەو هۆیەوە مۆری خۆیان بەسەر چەندان دەزگای کۆمەڵایەتیدا دا ئەکوتن •

بانقەکان لە سەرەتای کاردا تەنیا چەند هۆیەك بون ، پارەی خەوتویان لە ئەمو ئەو وەر ئەگرت‌و ئەیانخستە گەڕەوە ، پارەیان لە خەڵك وەر ئەگرت‌و ئەیاندا بە خاوەن سەرمایەکان ، هەر لەگەڵ ئەوەدا بانقەکان گەشەیان کردو فراوان بون •• پارەیەکی زۆر کەوتە دەست دەزگاو دامەزراوە بازرگانی‌و ئابووری‌یەکانەوە •

بانقه‌كان لـــه‌و رواڵه‌ته په‌یوه‌ندیكاری‌یه ساده‌یه ده‌رچون‌و بونـه هۆی‌بنچینه‌یی قازانجی ده‌زگا ئینحیساری‌یه گه‌وره‌كان‌و كارێكی زۆریان كرده سه‌ر لاوازی باری ئابوری كارخانه‌و ده‌زگا ئابوری‌یه بچوكه‌كان •

بۆ نمونه بانقه‌كان ، له سه‌ره‌تای چله‌كانه‌وه له ئێراندا وه‌كو « قارچكه گولانه »(٦) له هه‌مو سـه‌ری بازارو كۆلانێـكدا هه‌ڵتۆقیـن • ئه‌مانـه نیشانه‌یه‌كی به‌دیاری په‌لاماری ئیمپریالیستی بو به‌تایبه‌تی ئیمپریالیزمی ئه‌مه‌ریكا ، بۆ ئه‌وه‌ی بازاڕی ولات به ته‌واوی بخاته ژێر ده‌ستی خۆیه‌وه‌و ده‌ست زیاتر بكێشێته ناو كاروباری ناو خۆی ولاته‌وه •

بانقه تایبه‌تیه‌كان پاره‌یان له خه‌ڵـك وه‌رئه‌گرت‌و پاشه‌كه‌وتیان ئه‌خست‌و به قازانجێـكی كـه‌م‌و به قه‌رز ئه‌یان دا به سه‌رمایه‌داره گرێدراوه‌كان •

خاسیه‌تێـكی گشتی ره‌ووشتی سه‌رمایه‌داری بریتی‌یـه له فراوان بونی كاروباری ئاڵو گۆڕی بازرگـانی له بازاڕه ناوخۆییـه‌كان‌و بازاڕی ولاته گرێدراوه‌كاندا •• له سه‌رده‌می ئیمپریالیزمدا ئاڵوگۆڕی بازرگانی جیهانی فراوانتر ئه‌بێت ، له‌و قۆناغه‌دا سه‌رمایه ئه‌همیه‌تێـكی گـه‌وره‌تر په‌یدا ئه‌كات •

پڕ كردنـی بازاڕه‌كـان له كه‌لوپـه‌لی بازرگـانی له سـه‌رده‌می به‌رابه‌ر كێبركردنی ئازادا گه‌لێك بایه‌خی هه‌بو،به‌لام له سه‌رده‌می ئینحیسار كردنی بازاڕو كومپانیا گه‌وره كانـدا بۆته سـه‌رده‌می سـه‌رمایه • لـه‌و

---

(٦) ئه‌و جۆره قارچكه‌ن كه به ته‌نیشت یه‌كه‌وه ده‌ردێن‌و ناخورێن •

سەردەمەدا سەرمایە رۆڵێکی گرنگتر ئەبینێ‌و سوود مەند تریش ئەبێت .. کە لە دوو رواڵەتدا وەکو لای خوارەوە دەر ئەکەوێت :

**یەکەم :**

دامەزراندنی دەزگا سنعەتی‌و بازرگانی‌و بانقەکان لە وڵاتە گرێدراوەکاندا .

**دووەم :**

قەرزو قۆڵە دان بە دەوڵەتە داتاشراوە گرێدراوەکان‌و بانقەکانی وڵاتانی دەرەوە .

جگە لەمانەش رێگایەکی تر بۆ قازانج کردنی سەرمایەی بانقە ئەمەریکایەکان ئەوەیە کە بە زۆر پارەیان بە قەرز ئەدا بە وڵاتە گرێدراوەکان .

ئەو قازانجانەی بانقە ئەمەریکایەکان لە ئەنجامی قەرزو قۆڵەی بەزۆر داسەپاو بەسەر بانقەکانی دەرەوەو وڵاتە گرێدراوەکانا ئەیاندا ، زۆر جار ئەگەیشتە رادەی ٥ر١١ تا ١٢ لە سەد . لە زۆر کاتدا وڵاتە گرێدراوەکان هیچ پێویستی‌یەکیان بەو قەرزە داسەپاوە بەسەریانا نەبو .

قەرزو قۆڵەی هەمیشەیی ، ئەمەش رەووشتێکی تری بانقە ئەمەریکایەکانە ، بۆ ئەوەی زۆر تر وڵاتانی پێ گرێ بدەن بە خۆیانەوەو پارە لەو وڵاتانەدا زۆر بێت بەکاری ئەهێنن .

بانقە ئەمەریکایەکان لەگەڵ بانقە ناوەندی‌یەکانا لە سەر ئەوە رێکەوتوون ئەو فەرمانبەرانەی لە بانقەکانا کاری بانقی‌یان پێ ئەکەن

هەمیشە بە ئەندازەی پێنج تا پازدە ملیۆن دۆلار پارە لە حیسابی ئەو کار گوزارانە بەبێ قازانج لە بانقدا کار بکات ••

« ئەرونیک تراست »(٧)و « چیس مانهاتان »(٨)دو دامەزراوی بانقی گەورەی ئەمەریکایین کە بە زۆری پارەیان لە ولاتە گرێدراوەکانا بەکار ئەخەن •

کومپانیا گەورە ئەمەریکایەکان ، کە زیاتر لە جاران کەلوپەلیان هێنایە بەرهەم ، لەوە گەیشتن ئەو بازارانەی کەلوپەلو کوتاڵی تیا ئەفرۆشن ـ لەو ولاتانەی کە لە ژێر دەستی خۆیاندایە ـ پێویستە بازارەکان فراوانتر بکرێن ، وە لایەنگری گەشە کردنی باری ئابوری ئەو ولاتانە بنو توانای کڕینی خەڵك ـ تارادەیەك ـ بەرز تر بکرێتەوە •

دوای ئەوە ئەمەریکایەکان چەندان کارخانەی سنعەتیو بەستن « مونتاج » یان لە ولاتە پیشەسازی دوا کەوتوە کانا کردەوە ، بیریان لەوە کردەوە نەخشەیەك دابنێن بە پارەی ئەو ولاتانە چەندان کارخانە دامەزرێنن کە هەمیشە پیویستییان بە دەزگا سنعەتییە ئەمەریکایەکان بێت بۆ کەلوپەلی یەدەکیو بەستنی کارخانەکانیان • بۆ نمونە باسی کومپانیای « جەنرال موتورز » ئەکەین :

کومپانیای جەنرال موتورز ، پارچەی یەدەکی ئوتومبیل بەر لە بەستن ـ بۆ ئەوەی باجی گومرکی لێ نەدەن ـ ئەنێرن بۆ ولاتان ، ئەو پارچانە لە ولاتە گرێدراوەکاندا ئەبەستن •• دوایی وەها ئیدیعا ئەکەن گوایە ئەو ئوتومبیلە هەر لەو ولاتە دروست کراوە •• دوایی ئەمانە هانی

---

(٧) Aronek Trast.
(٨) Ches Manhatan.

ئەو کەسانە ئەدەن کە لە کارگەکانی بەستن‌دا(۹) کار ئەکەن بۆ ئەوەی خۆیان کارخانەی پێداویستی‌یەکان دابمەزرێنن .. ئەمەش مەگەر خاوەن سەرمایە سنعەتی‌یەکانی وڵات بتوانن ئەمکارە بە ئەنجام بگەیەنن .

دوای ئەوە سەرمایەیان کۆ کردەوە ئینجا یەکانگیر ئەبن‌و کارخانەکان دائەمەزرێنن .. بەڵام ئەم کارخانەیە هیچ بەهایەکی عەمەلی نامێنێت .. چونکە تالانکەرەکانی دەرەوە بە پێی نەخشەی خۆیان بەر لە گەشە کردنی ئەمکارە ئەگرن ، بۆ ئەوەی‌سەرمایەی ناو خۆ سەربەستی کار کردنی نەبێت ، کومپانیا گەورەکانی دەرەوە « بە یارمەتی دەوڵەتی داتاشراوی دەست نیشاندەی خۆیان » ، لە گەل خاوەن سەرمایەکانی وڵاتدا رێك ئەکەوون‌و چەندان پروتوکۆل مۆر ئەکەن کە بە پێی ئەو رێکەوتننامانە سەرمایەی ناو خۆ ئەوەندەی تر ئەبەستن بە سەرمایەی کومپانیا ئیمپریالیستی‌یەکانەوە لە بواری بە سنعەتی کردنی وڵاتدا .

کاتێك سەرمایە دارانی ئابوری ناوخۆ بەو جۆرە لەگەڵ سەرمایەدارانی وڵاتە ئیمپریالیستی‌یەکاندا ، بە سەرکردەیی ئیمپریالیزمی خۆێنخۆری ئەمەریکا » پەیوەندی یان بەست ، ئیتر بۆ ئەوەی ئیمپریالیزم درێژە بە رەووشتی تالانکەرانەی خۆی بدات لە وڵاتە گرێدراوەکاندا هیچ پێویستی نە بە هێزی دەریایی‌و نە دەستە کۆماندۆ پیاو کوژەکانی نابێت ، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی تالانکەرانەی خۆی بپارێزێت .. چونکە لەناو دەرونی وڵاتە گرێدراوەکانا لەشکرێك لە هێزەکانی ناوخۆ پێك دێت بۆ ئەوەی هەر دەنگێك بێزاری دەر ببڕێ بێ‌ی خەفە بکرێت .

---

(۹) بە مانا «مونتاج» ئەگرێتەوە ، واتا یەکخستنی کەلوپەلەکان ..

**دابەشکردنی ئابوری جیهان لە نێوان یەکێتییەکانی سەرمایەدارە ئینحیسارییەکانی نێو وڵاتاندا ..**

زۆر بونی سەرمایەو زۆر بونی پەیوەندییەکانی دەرەوەو ئەو ناوچانەی کە لە ژێر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی دەزگا ئینحیارییە گەورەکاندان ، ئەمانە خۆیان لە خۆیاندا زەمینەیەکی فراوانی بازاڕی جیهانی لە نێوان گەورە ترین دەزگای ئینحیساری وڵاتە ئیمپریالیستییەکاندا ئەرەخسێنن .

وڵاتە ئیمپریالیستییەکان هەمیشە بە چاوی بازاڕێکی جیهانی تەماشای وڵاتەکانی تر ئەکەن کە وەکو پیشانگایەك کەلوپەلی خۆیانی تیا بفرۆشن . ئەوەندە رێژی خەڵکی ئەو وڵاتانە ئەگرن بە ئەندازەی بوونە هۆی زۆر بونی قازانجو دەسکەوتو دەرامەتی خۆیان لە لایەن ئەو خەڵکانەوە .. ئەم دابەشکردنە جیهانییە خۆیلە خۆیدا عونسورێکی گەورەی هەڵگیرساندنی شەڕە لە نێوان دەوڵەتە ئیمپریالیستییە جیهانخۆرەکاندا(١٠) .

وڵاتە ئینحیسارییەکان لە جیاتی رەووشتی کۆنی سیاسەتی ئیستیعمار گەرانە ، سیاسەتی فرۆ فێڵاوی لە پێناوی بە دەست هێنانی سەرچاوەکانی کەرەسەی خاوو ، خستنە کاری سەرمایەو ، فراوانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیانو ، ژێر دەست خستنی ناوچە ئابورییەکانو

---

(١٠) هەروەکو هەمان مەبەستی شەڕەکانی یەکەمو دوەمی جیهانی ..

دامەزراندنی بنکەو پایــەی ســەربازی •• بەکــار ئەهێنن‌و خۆیانی پــێ ئەگرنەوە •

هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد ، ژێر دەســتە کــردنی خەڵــکی وڵاتە گرێدراوەکان‌و سود لێ وەر گرتنیان یەکێــکە لە خاسیەتە تایبەتیەکانی یاســای بنچینەیی سەرمایەداری ئیمپریالیزم •• ئەمکارە هــۆی هاتنــەدی ئیمپەراتۆری وڵاتە ژێردەستەکانە کە بە هۆی سەرکوتکردنی بێ بەزەییانەو سود وەرگرتنی زۆرو چەوســـاندنەوەی خەڵــکەوە لە لایــەن دەزگــا ئینحیساری‌یەکانەوە پێک دێت •

دابەشکردنی وڵاتەکانی جیهان تا سەرەتای ســەدەی بیســتەم تەواو بوبو ، بۆ ئەوەی وڵاتی تازە سەر لەنــوێ داگیر بکرێتەوە پێویســت بو وڵاتان لە دەست دەوڵەتە ئیستیعماریە کانی تر بسەندرێتەوە •

شەڕی ساڵی ١٨٩٨ی ئەمــەریکا دژی ئەســپانیا ، « لەو شــەڕەدا ئەمەریکا توانی کۆمەڵە دورگەکانی فلیپین ، گوام ، هاوایی ، کوباو ••• » بگرێتە ژێر دەستی خۆیەوە •

شەڕەکانی یەکەم‌و دووەمی جیهانی ئەمانە لە پێناوی ســـەرلەنوێ دابەشکردنەوەی وڵاتانی جیهاندا هەڵــگیرسان •

لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا ، سیستەمی ئابوری جیهانی سەرمایەداری دێتە کایەوە ، سەردەمی ئیستیعماری نوێ دەست پێ ئەکات • ئیستیعماری نوێ بەمانا ـ ئیتر پاراستنی باری ئاسایش‌و سەرپەرشــتیکردنی کاروباری ناو خۆی وڵاتان بە دەست وڵاتە ئیستیعماری‌یەکانەوە نابێت ، بەڵــکو بەڕێوە بردنی هەمو ئەرکێــکی ناوخۆی وڵات بە دەستی کەسانی ئەڵقە لەگوێی ســەر بە ئیســتیعمارەوە ئەبێت ـ •• تا لەو قۆناغــەدا وڵاتە ژێر دەســـتە گرێدراوەکان بە توندی ئەکەونە بەر مەودای کاریگەرێتی سیستەمی ئابوری ئیمپریالیزمەوە ••

## سوپاس :

سوپاسی برای هونەرمەندو خۆشنوس کاك ئەحمەد سەعید
ئەکەم کە ناو نیشانی ئەم نامیلکەی بۆ نوسیم ••

لە نامەخانەی نیشتمانی ژمارە ( ١٤٢٨ )ساڵی ١٩٨٤ ی پێدراوە •••

